بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: قەڵەمی کچێک
لە نێوان دڕکی ئازارەوە بۆ شیرینی قەدەرێک
نووسینی: شەم سیا
بابەت: ئامۆژگاری
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٤ کۆچی – ٢٠٢٣ میلادی

## بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

دەستپێکی هەموو کارێکی خێر ناو هێنانی خوای باڵادەستە و سوپاس و ستایش بۆ ڕب العالمین لە وێستگەیەکی نوێ دا کردینی بە خزمەتکاری خۆی بە نامیلکەیەکی بچوک بۆ ئێوەی خوێنەری زێدە ئەزیز
هەڵبەت کۆکراوە و گوڵبژێری نوسینەکانی خۆمە کە لە پەیجە شیرینەکەی شنەی ئیمانەوە تەنها بە پۆست دەستم پێکردوە لە فەزڵی الله

پاشان پێشنیاری برا و خوشک و پاڵپشتی دۆستانێک لە چوارچێوەی پۆستەوە بردمانە قۆناغێکی نوێ ئەویش ئەم نامیلکە یان پێ دی ئێفەی بەردەست بەڕێزتانە

لە قوڵایی دڵ و ئازارێکەوە چرۆی کردوە، بە ئیزنی الله بۆ خۆیشم و بۆ ئێوەی ئەزیز، ئەبێتە سنەوبەرێکی پڕ سێبەر و ئارامی بۆ دڵ و ئازاری هەر یەکێکتان هەر ڕاستیەکیشم پێکابێت لە ڕەحمەت و فەزڵی خوای گەورەوە بوە، هەر هەڵەیەکم کردبێ لە نەفس و شەیتانەوە بوە
بمێنن بە خێر و سەلامەتی و هیدایەت و دامەزراوی دین خۆشبەختی دونیا و گۆڕ و قیامەت بن.

چاوەڕێی دوعای خێرین لێتان ...

# (١)

بـارانێک لە چـلەی هـاوین ببارێنێ ...
ئەی چۆن ئازار و دڵتەنگی تـۆ
کۆتایی پێ ناهێنێت ...؟
ئەو  الله تعالی یە
بەس ئەفەرموێ کن فیکون



# (٢)

ئەڵێن: دەردە دڵ
بۆ یەکێ بکە هەم دڵی هەبێ
هەم دەرد
منیش ئەڵێم : دەردە دڵ بۆ خالقی کەون بکە
ئەو خالقەی لە شادەماری ملو نزیکترە
ئەو خالقەی لە دایکو بەڕەحمترە
هەم کە دەردەکەی ناردوە
هەم شیفاکەی لایە
هەم نەک سەعاتێ ٢٤ سەعات ئاگای لە تەنگی دڵ و
گوشینی سینەتە لە ئازاردا
خالقو تەواوی چیرۆک و ئازارەکەو تەواوی قەدەرە نوسراوەکەو ئەزانێ و
بیسەریشو ئەبێ (ولله مثل الاعلی)



## (٣)

لەم قرچەی گەرمای نیوەڕۆیەدا
ئەبێ چەن دڵ هەبێ هەڵبقرچێت
بەهۆکاری جیاواز
خوای میهرەبان
دڵەکان بەدەست تۆیە
هەر کات ویستو هەبێت دروستی ئەکەیت لە ڕەحمی دایک
هەر کاتیش ویستو هەبێت دڵەکە ئەوەستێ
دڵێک بکەیتە نسیبمان
پڕ بێ لە ڕەزامەندی تۆ
شوکر و سوپاسگوزاری تۆ
نورو پرژی ئیمان و هیدایەت و دامەزراوی دین
ئارامی و شیفای تۆ



## (٤)

کچەکان لەمـ شەوی یەڵدا
واز لە پـــڕتەقاڵ و توێکڵی پڕتەقاڵ بهێنن مەیخەنە ژێر سەرین
گوایە لە خەوتا ئەو کوڕە ئەبینی کە ئەبێتە هاوسەرو
الله تعالی خـــۆی لە عەرشەوە
ناوی حـــەڵاڵەکەتی نوسیوە و بۆی دیاری کردوی
ڕزقەکەی خـۆتی بۆ داناوی
دەقەیەک و ساڵێک
دوا ناکەوێ و پێش ناکەوێ
هەموو پڕتەقاڵی سەر زەوی
بخەیتە ژێر سەرینو
ویستی خوای لە سەر نەبێت
زەواج ناکەی !



## (٥)

یـاربی
بانگی عیشایەک بێت
تۆ سەرقاڵی سوجدەی شوکر بیت
بۆ الله تعالی
کە ڕزگارو بوە لە دەرد و بەڵا و نەخۆشی و ناڕەحەتی



## (٦)

قەت ڕاوکردووە لێی
یانیش کاتێ قالۆنچە و شەوگەرد دیوە
هەوڵ کوشتنیو داوە
ئەی ڕبی خاک بەسەرم
لە نێو گۆڕی تەنگ و تاریک
یەکەم شەوی گۆڕ و بەو کفنە سپیەوە
ئەو هەموو مێرووی ژێر خاک
هێن بە سەرتا بۆ کوێ ڕاکەین چۆن لە خۆمانی دوورخەینەوە
یـاربی پەناو پێ ئەگرم لە سزاو سەختی نێو گۆڕ
یـاربی وەڵام دانەوەی فریشتەکانی نێو گۆڕمان بۆ ئاسان بکەیت
یـاربی گۆڕمان بۆ فراوان کەیت و
بیکەیتە باخێک لە باخەکان بەهەشت
اللَّهُمَّ إِنيِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرْ , و مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ, وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّال
خودایە پەنات پێدەگرم لە سزای ناو گۆڕ و سزای دۆزەخ و ئاشوبەی ژیان و ئاشوبەی مردن و خراپەی ئاشوبەی مەسیحی دەجال، اللهم امین

## (٧)

یـــــاااربی
بەم کاتی پیرۆزی بانگی عەسرە
یەکێک لە نوێژەکانو
بە گریانی خۆشیەوە ئەنجام بدەیت
یاربی یەکێک لە نوێژەکانو
بە ئاواتی حەڵاڵی دڵتەوە بکەی
یەکێک لە نوێژەکانو
بە شیفا و موژدەی خێرەوە بکەیت ...



## (٨)

بە تعلیقەوە وتی:
لە ژێـــر ئەم عـــابـــا ئەبێ چی حەشار درابێ ؟
ئەڵێی یاپراخی گەڵامێوی
بە پێکەنینەوە
وتمـ ئەڵماس و مرواری
نێو ژێر دەریاکان
هەموو کەس هەستی پێ ناکات و دەستی پێ ناگات
هەموو کەسیش نایبینێت
چونەکە شـــایانی بینین نیە
موڵکی هەموو چـــاوێک نیە
کەسی تایبەتی خۆی ئەوێ !
ئەو ژێر عابا ببینێ !
کە حـــەڵاڵەکەتە
سەری داخست و
بێ دەنگ بو

## (٩)

لەمـ کــززە بــا ساردەی ئێوارەدا ...
دڵانێک هەن سارد سارد
چەشنی ساردی ئەمـ سەرما جەستەو دڵ و ڕۆح ئەتەزێنێ
هەناسە سارد و  فرمێسکیش گەرمـ
یـــارب
ئەمـ ساردی و تەزانەی دڵەکان
کۆتایی پێ بهێنە
بە ڕەحمـ و سۆزی میهرەبانی خۆو
بە قودڕەتی خۆو
بەستەڵەکی چاوەڕوانی وئارامگری
بەستەڵەکی خەمـ و دڵتەنگی وفرمێسکەکان بتوێنەرەوانێ ...
یــارب یـــارب یـــارب



## (١٠)

مامۆستاکەم ئەیفەرموو
خوای گەورە تۆی لە قەدەڕێک پاراستوە
وە لە هەمان کاتدا تۆی هەڵگرتوە بۆ قەدەڕێک
جا نمونە: ئێستە لە تەنگانە و دڵتەنگی دا و دواکەوتویت لە هەموو شادییەک ! پارێزراویش لە بەڵایەکی گەورەترتەشبیهـ نەبێ شورایەکە
پاشان لەم قەدەرە تاقیکردنەوە دەرئەچیت بە شوکر و صەبرەوە
الله لوتفی خۆی ئەرژێنێ بەسەرتا
دوای تاڵیەکی زۆر
قەدەڕێکی باڵا شیرینت پێ ئەچێژێت
کەئەننەما ئەو نەفسە هیلاک و بەئازارەت
هیچ تاڵی و نارەحەتیەکی نەچەشتبێ



## (١١)

خوای گەورە
کۆکردنەوەتان پێکەوانێ
بکاتە بەرەکەتی دونیا و
ڕوناکی نێو گۆڕ و
شادبونەوەی بەهەشتان



# (١٢)

لەم نـاوەڕاستی ڕەمەزانی پیرۆزەدا
قاپێک خورمای عەجـوە
دەبەیەک ئاو
لە نیەتی شیفا و پەڕاندنی ئازارو ناڕەحەتی لە گیانو
گەر پێو کرا هەموو سورەتی البقره بخوێنە بەسەریا
یانیش نەوتوانی
تەنها حەوت جـار
هەر یەک لە ئایه الکورسی
سوره الفاتیحـه
سوره الفلق
سوره الناس
سوره الاخلاص
بخوێنە بەسەریانا
با یەکەم خواردنی بەربانگ
کۆتا خواردنی پـاڕشێوت
ئەو ئـــاو خـورما عـەجوە بێت

## (١٣)

بیری پۆستەکانی منتان ئەکرد ؟
خــودا
ئەمشەوت
بۆ بکات
بە شەوی شیرینی حـەسانەوەو لە سایەی تـاڵی
ئـارمگریو



## (١٤)

ئەو خوشکە بـــاڵاپۆشانەی
بە تەواوی باپەندی شەرعن
قفڵێکی ئەبەدین و
بە کلیلە تایبەتە حەڵاڵەکەیان ئەکرێنەوە
بەخوا ئەوانیش ئارەزووی ماکیاج وو پاوانە و خۆڕازاندنەوە وجلی کەشخە
و بۆنی سەرنج ڕاکێشن ...
بەڵام ئەزانێ
لە کوێ
لە کەی
بۆ کێ ...؟( هاوسەرەکەی )
خۆی نمایش ئەکات ...
ئەو ئەزانێ ...
موڵکی هەموو کەس نیە
ئەزانێ ناسکیەکەی نابێتە پارووی هەموو کەس
کلیلێک نیە هەموو دەرگایەکی پێ بکرێتەوە
کتێبێک نیە هەموو کەس بیخوێنێتەوە

## (١٥)

خوشکی بەڕێز
حیجاب بیت هەر دەمریت
ڕووتیش بیت فول سفور هەر دەمریت
هەتا سەرو ئەژنۆت ڕووت بێت و
پاوانە و پێستی ناسکت چاو مەست بکات ، سنگت دیار بێت
هەر ئەمریت
جا تایـبەت بۆ خوشکانی سفور
بۆچی ئەهێڵی ، مردوو شۆر بۆ یەکەم جار جەستەو داپۆشێت
بە بێ پاوانە و بەبێ ڕازاندنەوە



## (١٦)

کچانێک هەن
هەتا ئێستە
نازانرێ قەڵەوە یانیش زەعیف ...؟
ئایا پاوانە ئەکات یانیش نا ...؟
ماکیاج ئەکات یانیش نا ...؟
نازانرێ تۆنی پێکەنینی چۆنە ؟
الله کچانی وا ئیماندار و لە خواترس
بکاتە نسیبی برایانێکی تایبەتمان



# (١٧)

من ، ئێوە ناناسم
بەس ناوی فەیسبوکەکانتان
ئەزانم و هاتوتە پێش چـــاوم
یــــاربـــــ
ئەو ئازارەی جەستەی داگیرکردوی
الله لێزمە بارانی شیفای بەسەرا بیارێنێ
ئەو فرمێسک و نائارامیەی دڵی تەنگ کردووی
الله کۆتایی پێ بهێنێ و بکاتە خۆشی و فەرەحی
ئەو خەونەی لە چاوەڕوانی گەشتنی پێی
الله شادت بکات بە خەونەکەت....
اللهم امین یارب



# (١٨)

ئاوی ساردی نوێژی بەیانی و بۆی عـەتر
خـەبەرو نابێتەوانیٚ ؟
خـەوو قوڕسە ؟
بە ئاوی سارد دەست نوێژ بگرە خەوت ئەڕوا
زیاتریش خەوو ئەڕوا کە بۆنی عەترێک هەڵمژیت و بۆن عەترەکە بچێتە
مێشکو ئەی بۆچی خەوو قوڕس نیە ؟؟؟
هەتا بەیانی فەیسبوک و یاری پۆپجی بکەی
یانیش سەعی بکەی بۆ تاقیکردنەوە
خۆشبەختیتان موبارک و
لە سایەو سێبەری بەرەکەتەکە و نورەکەیدا
حەساوەی دونیا و گۆڕ بن و
پلەتان بەرز بێتەوانیٚ لە قیامەتیش
هەڵگران و شەیدایانی قورئانی پیرۆز و تجوید
بەس ئەوانە هەست بە چێژەکەی دەکەن و تێدەگەن لێم
الصفير ، التكرير ، التفشي ، الاستطاله ، اللغنه قطب جد
الهمس  الجهر الأستعلاء الأستفال الشديده الرخاوه البينه

## (٢٠)

قوڕئانەکەمانە تاجی سەر ...
دەمێ ڕێبەر ، دەمێ ، ئارامش ، دەمێکیش سێبەر
هاوار ئەکەین قوڕئانی پیرۆز بەرنامەڕێژە
تاوێ عەترە ... تاوێ میسک ...تاوێکیش گوڵاوڕێژە
لەوێ بە چەن هەوڵی نەزۆک ، چەنەها قوڕئان بسوتێ
لێرەش لە دڵی موسوڵمانان نور و پڕژی قوڕئان ناوەستێ



# (٢١)

خەونی سادەی دڵی کچێک
ئەمەوێ بەیانیان
بە ساردی دەستی دەستنوێژی خۆم و
بۆنی عەتری بەرماڵەکە مەستی بکەم
ئەمەوێ هاوسەرەکەم
لە ژوورەوە ، لە بەردەم هیتەرەکەدا
قورئان بخوێنێت و منیش بۆی ڕاست بکەمەوە
بڵێم: ئەو ئایەتە شەددەی ئەوێ
ئەو ئایەتەی تریش مەددەکەی کورت ئەبێ
وە ئایەتی دواتریش ئەتوانی لەسەری بوەستی
ئەشتوانی بڕۆیت بیخوێنیت ...
ئەمەوێ شەوان سورەتەکانی الملک و السجده پێش نوستن
ڕۆژانی هەینی سوره الکهف
ڕۆژانەش سوره البقره
پێکەوە بخوێنین ...

## (٢٢)

هــەفتەی وەفـــاداری
"اللَّهمَّ"صَلَّ"وَسَلَّمْ عَلَىٰ"نَبِيَّنَا"مُحَمَّدٍ
بۆ پێشەوای مرۆڤایەتی تاجی سەر
هەر لە خۆت دێت ڕابەری و سەروەر
لە پەیجی شنەی ئیمانەوە
ئەی پێغەمبەرم تۆ شیفا و بەرەکەتیت ...
بۆ هەموو جیهان ڕێژنە ڕەحمەتیت ...
یەک پارچەش سکونەتیت !
تۆ گرنگیت  سپێدە و گزنگیت ...
مانگی چواردەی نێو شەوە زەنگیت !!!
سەرشۆڕی بۆ گشت هەوڵی نەزۆکتان !
ئاگر بەر ببێت لە سینەو بەرۆکتان ...
یاخوا نەمێنێ ناو و سەرۆکتان ...



# (٢٣)

ئەگەر چاوت ببەستنەوانێ ...
بوبەنە ئەو شوێنەی خەونەکەتی تێدا ئامادەکراوە
ئەبێ چی هەستێکو هەبێ ...؟
ناڵێیت سوپرازە؟
ناڵێیت چاوەڕوان نەکراوە ...
دەی ئەکید بە
خوای گەورەش کاتی ئەو گەیەنێت بە خەونی چەن ساڵەی دڵو یانیش
دوعاکانی ڕەمەزانو شەوانی قەدرو
کە تۆ هەر ئەشێت لەبیرو نەمابێت ...
لە عەرشەوە خوای گەورە ئامادەکاری کردوە بە فەرمانی کن فیکون
ئێهـ تۆش لە زەویەوە ...
ژیان ئەکەیت و ئەشێ بەینی خۆمان بێت ناشکوریشو کردبێ
خەجاڵەتم یاالله



## (٢٤)

چەنێک سارد بێت
پلەی نــزمتر بێتەوانێ
نـــــوێژی بەیانیو
چـێژێکی ئیمـانی و تایبەتی هەیە
بەو ئاوە ساردە
ئاگری دۆزەخی پێ بکوژێنەوە
تەنهـــا ئەو کەسانە لێی تێدەگەن
کە تامیان کردوە
ئیتر وەرنە ڕیزی هاوسەفەرانی
نـوێژی بەیانی
ئاوە ساردەکەی
دەست نوێژی بەیانیانو
بۆنی شیفایەک ئەدات
بۆ هەموو جەستەو
هەست ناکەی سەرماو بێت
هەست ناکەی ساردی بگاتە جەستەو

## (٢٥)

ئەجەلو کاتی مـردنو نوسراوە
هەزارو یەک لە
ڤایرۆس بێت و نەخۆشی و کۆڕۆنا بێ ...
تا کاتی تەمەنو تەواو نەبێت
نـــامریت
ئەی نەفسەکە تۆ هەر ئەبێ مردن بچێژیت
دەمامکێک
قەدەرو فەرمان و ئەجەلی الله تعالی
نە دوای ئەخات و نە پێشی ئەخـات
(قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَا وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ)
التوبَة : ١٢٨٦

واتە بڵێ: -ئەی پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- قەت شتێکمان تووش نایە، خوا خۆی لە(لوح المحفوظ)دا بڕیاری نەدابێ بۆمان هەر ئەویش بۆخۆی گەورە و سەروەرمانە موسڵمانان دەبێ پشت و پەنایان هەر خوابێت .

## (٢٦)

هەندێ ئـازار هەیە نە پزیشکی دەرونی
نە پزیشکی جـەستەیی
هیچ هیچ سارێژی نـاکات ...
تەنهـا و تەنهـا
ئەو ئـازارە نـادیارەی هەیە
بە شـەونوێژ
لـە فـەزڵی الله تعالی
سـارێژ ئەبێت و
شیفایەکی دڵڕفێنی بـۆ نازڵ ئەبێت
لە سێیەکی شەودا و
لە حـەوت تەبەقی ئـاسمـانەوە
تـاجی ئـارامی و حـەسـانەوە
ئەکرێتە سەر دڵ و جـەستەی ...

## (٢٧)

لەمـ کزە با ساردەی ئێوارەی پیرۆزەی هەینی یەدا
بە دەستی دەستنوێژ و دەستی قورئانەوە
یـــــاربی
چی خەونێکی حەڵاڵی هەیە لەو دڵەتە
کە خـێری دین و دونیا و قیامەتی تێدایە
الله بیکاتە قەدەرو
یـــاربی چی ئازار لەو گیان و جەستەتە
الله شیفا بارانی بەرەکەتی بە سەرا داباریێنێ
یـــاربی چی خەمـ و فرمێسک و دڵتەنگیەکە
ماندووی کردوی
الله لە سەر دڵ و دەرونتی هەڵگرێ و بیات بە شاخەکانا
یـاربی هەرچی سیحر و جادوویەک
ژیانی لێ کردوی بە دۆزەخ و ئاگر
الله لەگەڵ ئەم بارانە دا
بارانی خۆشی و بەتاڵبونەوەی بە سەرا بیارێنێ
اللهـمـ امـــین

## (٢٨)

دواخستنی
وەڵام دانەوەی
پەروەردگار
بۆ بەندەکەی حیکـمەتی خۆیەتی
چ خـــەمتە؟!!
کە تـۆ لە نـــاو حیکمەتی پەروەردگاردایت
کەرویشکەکەمـ



## (٢٩)

بـاوکەگیان
لەدووری تۆ بێنازی تۆ
ئەها کچەکەو گەورە بو !
چی ئەبو لەلای بایت
هاوبەشی خۆشی و گریان و ئازارەکانی بایت
ئـاهـ خۆزگە لێرە ئەبوی
بۆ منی نازدارو وەکو پەروانە ئەبوی
چۆن منو ماچ ئەکرد
ئازارەکانیشمو ماچ کردایە
بە خوێندنی شیرینی ئایاتی قوڕئان
بەسەرما دڵمو بردایە



## (٣٠)

کە کچ بویت
ناکرێت ناسک نەبیت
ناکرێت ڕەنگاو ڕەنگ نەبیت
ناکرێت نازو مەکرو نەبێت
ناکرێت دەنگ ناسک نەبیت
ناکرێت پەنجەو بە بۆیەو خـەنە نەبێت
ناکرێت دەست بەرداری بۆن خۆشیو ببیت
ناکرێت دەست بەرداری نازداری پاوانەی پێستو ببیت
ناکرێت شەوان تێر نەگریت و
ڕۆژیش تێر چاوانو ماسکارا بکەیت
ناکرێت .... ناکرێت ...
بەڵام تەنها بۆ حەڵاڵ و ئەو کەسەیی ئەبێتە هاوسەر و ئارامی جێژوانت
نەك بە حەرامی ئاگری دۆزەخ بۆ خۆت سازکەیی .
کەروێشکەکەمـ

# (٣١)

ئەی کـــچ
لە کاکی زاوا
داوای ئەنجــام دانی وەلیمەکەی لێ بکە
تا بەرەکەت بباریێ بە سەر زەواجەکەتان
کە مـەڕێکو بۆ سەر ئەبڕێ و
ئەکرێتە ئێوارە خــوانێک
لە سێ یەم ڕۆژی گــواستنەوەکەو
نەک
حەفلەی ناشەرعی ڕەشبەڵەک و گۆرانی و
ساڵیۆن و عەزیەی ڕووت
کە پێشی حـــەڵاڵەکەو
چی کوڕ و پیاوی خزمی هەر دوو لایە
نەزەڕو لێ ئەکەن ...!
کەرویێشکەکەمـ

## (٣٢)

ئـــەو خـــالـــقـــەی
کە هەموو کـــەون
لە ژێـــر فـەرمـــانی یەکـ لەحـــزە
کـنـــ_فیکـــون ی ـــ دایە
زۆۆر بە دیـــقەت بـــڕوانن کە چـــــۆن ؟؟
دەنـــکـــە_شـــوتیەکـــان
یەکـ یەکـ دەخـــاتــە نـــــاو تــوێکڵەکەی
خـــۆی ئـــەزانێت و زانایە بەوەی
تـــۆ
دەخـــاتە نـــاو کـــامە دڵـــەوانێ...



## (٣٣)

ئەڵێم : قەت بیستوتە
یانیش چویتە نەخۆشخانە
کە ئەنجامی فەحسەکانو وەربگریتەوانێ
الحمدلله پاک بوە
یانیش دوای چارەسەریەک بۆ ماوەیەکی دیاریکراو
بە فەزڵ و شیفا بەخشی الله
نەخۆشیەکەو پەڕاندووە
ئێهـ دەی قەسەم بە تاک و تەنهایی الله
ئەو کەسەیشی ڕۆژێ جێو دەهێڵێ
هەر ڕێک وەک ئەو نەخۆشی و فحسە وایە
کە ڕزگارو ئەبێ و الله شیفاو بۆ ئەنێرێ
لێو دوور ئەخاتەوانێ
ئەبێ تا ماوی سوپاسی خوا بکەیت

کەروێشکەکەمـ

## (٣٤)

یــــا الله
چـــــاوەڕێی
خـــــێری ئەو قەدەرانەو لێ ئەکەم
کە هێناوتە ڕێم ...

کەروێشکەکەمـ



## (٣٥)

لەم شەوە پیرۆزەدا ئەڵێم :
بەڵکو خوای_پەروەردگـــــار
بە شتێک قەرەبوت بۆ بکاتەوانێ
لەوە خۆشەویستر و شیرینترو
پڕ خێرتر بێت بۆو
کە لە دەستو داوە...

کەروێشکەکەمـ



## (٣٦)

کچــەکان فــێر بکەن
دڵـــــیان
خێمەکەی کۆچبەران نیە
تا بدرێ بە هەموو کوڕێک
کە ئەچنە سەر سنوور پشو بدەن
یەک دڵ دروستکرا
تا فیدای یەک کوڕ بکرێ
بە حـــەڵاڵی

کەروێشکەکەمـ



# (٣٧)

کچ ئەبێت
بۆنی نـاز و مەکر و
بۆنی نـاسکی و عەتری لێ بێت
عەتر بەس بۆ ماڵەوە
نەک بۆن جـگەرە و نێرگـەلە و
ئالودەی قومـاڕ و بـاڕ بێت
کوڕیش ئەبێت
بـۆنی میسک و عـەتر و
پیـاوەتی و مەردی لێ بێت
نەک بۆنی جـگەرە و مەشروب و قومـاڕ و ماددەی هـۆشبەر



# (٣٨)

خــوشکی مــن
بــۆ حـــــــــــــەڵاڵەکەی خـــۆو
بــۆ تەواوی نـامەحـرەمانیش
هـێڵی_سـوور
بۆن عەتر و بـۆن خــۆشییەکەو
بـا تەواوی مـاڵەکەی خـۆو داگیر بکات
بەس نەچێتە هەناسە و لوتی
هیچ نـامەحـرەمێک لە دەرەوە
بـا دەنگی پــاوانە و خـڕخـاڵەکەو
گشت ماڵەکەی خـۆو بهێنێتە سەما
بەس نەچێتە
بەر چـاو هیچ نـامەحـرەمێک و بیسەری نەبێت
بـا تەواوی جـوانی و جلی سەرنج ڕاکێشو
شەوقی ماڵەکەو بداتەوانێ
بەس جەستەی ناسکو
بەر چاوی هیچ نامەحـرەمێک نەکەوێت

## (٣٩)

لەمـ ساتی نزا بارانە
لە زەوییەوانێ بۆ عەڕشەکەی پەروەردگار و
دەمەو ئێوارە پیرۆزەی هەینی یەدا
یـــاربی سحرە ڕەش و قورس و ئاسانەکان
هەڵوەشێنیتەوانێ ...
قفڵەکان بکەیتەوانێ
قەڵەمی ساحرەکان وشک بکەی
چاو و نەفەسە پیسەکان
ڕاگریت و وشکیان بکەیت
کۆتایی بە شەڕو ئاژاوە بهێنیت
کە کەوتۆتە نێو ماڵ و خێزانەکان
کۆتایی بەو ئازارە دەرونی و جەستەیانە بهێنێت شیفایان بۆ نازڵ بکەیت
کە بەهۆی سیحرو چاوە دەناڵێنن
هیچ چارەسەرێکی پزیشکی
شیفای نادات جگە قودرەتەکەی خۆو
ﷺ۩۩۩

# (٤٠)

وای لەو چـرکە ساتەی
قەدەری خـوای پەروەردگـار
هێتە دی و
لە بەردەمـ جەنابی ڕێزدار مامۆستا و
شاهیدەکان
عـابـای مـن و
قاتە ڕەشەکەی تـۆ
خۆی ئەنوێنێ
عەشق هێدی هێدی چـرۆ ئەکات ...
لە ژێر سێبەر و بـەرەکەتی حـــەڵاڵی



## (٤١)

بە خوێندنی
دوو ئایاتی کۆتایی سورە البقرە
سورە الملک و السجدە
پێش نوستن
شەوانو نور پرژێن بکە ...
چی خۆشبەختیەکە ها
بە خەوتویش لە پارێزراوی و ئەمانەتی خالقەکەو بیت ...



## (٤٢)

ئەو خوشکانەی گەنجن و یان تەمەن تۆزێک گەورەن
فول_داپۆشراون
عەبا و نیقاب و دەستکێشن
یانیش تەنها عەبان ماکیاجیش ناکەن
لەچکی زەق و چاو شەحن کەرەوە ناپۆشن
پێیان ئەوترێ : ئەمە چیە ئەم دواکەوتوییە
خۆ تۆزێک وەکو ئافرەتێکی ناسک ناژین
بۆچی هەر لە ئێستەوە خۆتان پیر کردووە
دڵتان وشکە ، دڵتان مردووە
بوەستن نـا نـابەخوا ، دڵیان زیندوو
دڵیان تەڕ هاوشێوی بـاران و..
ئەوانە پیر نین ئەزانن بۆ کێ ناسکی خۆیان نمایش ئەکەن
ئەزانن بۆ کێ کام جلەی جوان و سەرنج ڕاکێش ئەپۆشن
تەنها بۆ چاوانی_حەڵاڵەکەیان
خۆیشی کردووەتە قەفەسێکی_شیرین
هەتا برایانی_نامەحرەم توش تاوان و نەزەڕ نەکات

## (٤٣)

لە ئایاتی ١١٧ ی سورە البقرە
کن فیکون
هاتوە
یاربی بۆ شیرینی وژیانی خـێر و فەرەحی وشیفا و حەڵاڵی دڵی
منیش و ئەدمین و ئەندامەکانی
شنەی ئیمانیش
بفەرموو کن فیکون
وەک پاداشتێ بۆ ئەو تاڵی و نارەحەتی و ئازارانەیگەیشت بە قوڵایی ڕۆح
و جەستە ودڵمان



## (٤٤)

لەم شەوو ڕۆژی هەینی پیرۆزەدا
لەم دوای نوێژی عیشایەدا
یا الله
هەموو دەرگاکانی دونیا داخراون
کلیل و قفڵەکان ونبون
تەنها دەرگای تۆ کراوەیە و
کلیلەکان لای تۆیە
بە قودڕەتی خۆو یاالله
دەرگا داخراوەکانمان بەسەرا بکەرەوانێ ...
یارب یارب یارب



## (٤٥)

ئێمەی کچان و خاتونانی
شوێن کەوتەی خاتوو خەدیجە و خاتوو عائیشە و خاتوو فاتیمە خاتوو مەریەم سەرپۆش و باڵاپۆشیمان
تاجی زێڕینەو لە ئەڵماس گران بەهاترە
نەک تەنها سەرپۆشەکە
خودی خۆیشمان بە لەچکەوە بسوتێنرێت
جێی شانازیە بۆمان چەنێک لەچک و سەرپۆش بسوتێ و ...
دژایەتی بکرێت هێشتا ئەو ئاگری ڕق و توڕەییەتان ناتوانن بکوژێننەوە
چونەکە نوری ئیسلام و دینداری بە فوی دەمتان ناکوژێتەوانێ
وە ڕۆژ بە ڕۆژ چەنەها تازە خونچەمان هەن
کیژۆڵەی ناسک و نازدار
بڕیاری بون بە باڵاپۆش و لەچک بەسەری ئەدەن
ئەبنە پەروانە لە دەوری شەمعی ئیسلامەتی و ڕێبازی شاڕێگەی هیدایەت و دامەزراوی ...با هەتا مردنتان
مولحید و بێ دین و بە ناو پارێزەری مافی ژنان و کچان کوێرایی چاوتان بێ.

## (٤٦)

کچەکان
ئێوە بۆنی گوڵێک یان ڕێحانەیەک یان عەترێک ئەکەن کە دەستی دوو بێ واتە پێشتر بۆن کرابێ؟
یان عەترێکی نیوە ئەکڕن ؟؟؟ بڕواناکەم بۆنی بکەن و بیشیکڕن !!!
دەی قەسەم بە الله خۆشەویستی حەرامیش وایە
ڕابواردن و کات کوشتن و چاتی حەرام و
دەست گرتن و موعید دانان لەگەڵ کوڕە بە ناو خۆشەویستەکەو
ئەکەی هەتا دەستەمۆو ئەکات ...!دواتریش کوڕەکە تۆی ناوێت !!!
جێو ئەهێڵێت ، لە دووڕیانی هات و نەهات و خەم و خەفەت و دابڕان فڕێت ئەدات
چونەکە بە درۆ و بۆ ئارەزوی گەنجی خۆشی ویستوی
چونەکە بۆنی کردی و چێژی لێ وەرگرتی
تەواو تێر بو لێو ئیتر فیلمەکە و نواندنەکە کۆتای هات.
ئەچێ بەدوای ژیانی واقیعی خۆی زەواج ئەکات
لەگەڵ تۆ نا
بەڵکو لەگەڵ کچێکی تازە و دەست لێ نەدراوی بۆن نەکراو .!

## (٤٧)

بۆ کوڕە سەرە ڕۆکانی دابڕاو لە " الله جل جلاله"  تەمەن چەنێکە ... ؟؟؟
هەتا کەی جگەرە ئەکێشن ؟ مەشروب ئەخۆنەوە ؟ سەرخۆش ئەبن
هەتا کەر تاتۆو زنجیر و بازن و پانتۆڵی تەسک ئەکەن ؟
هەتا کەی ڕێگەتان گازینۆ و بار و قومارخانەکانە ؟
هەتا کەی بە دوای کچانەوە ئەبن ؟
هەتا کەی گوێڕایەڵی هەواو نەفس و شەیتان ئەبن؟
ئەبنە سوتەمەنی و خەڵوزی دەستی شەهوەت و نەفسی بەدکار ...
بۆچی سەیری ئەو کوڕانە ناکەن چاویان لێ ناکەن کە ڕوو لە خودان پێنج فەڕزە لە مزگەوتن و بەشداری کۆڕ و وتار و خولە پەروەرەدەیی و دینیەکان ئەکەن ئەوکوڕانەی دیندارن و ڕیشی سوننەتی دادەنێن و پەروەردەی دەستی مزگەوتن نازانن دەستی کچ چۆنە گەرمە یان ساردە ؟
نازانن تام جگەرە و مشروب چۆنە؟
نازانن ڕێگەی باڕ و قومارخانە و دیسکۆکان ...!
یارب کوڕە سەرەڕۆکان ەهیدایەت بدەی و لە کەلەی شەیتان بهێنە خوارەوە زیاتر و زیاتریش کوڕە دیندارەکانمان دامەزراوتر و جێگیرتر بکەیت لە سەر ڕاستە شەقامی نوری ئیسلامەتی و دینداری ...

# (٤٨)

بـاخی بوکێنیت
ناسکیت
عەجولیت
ناز و مەکرت
پێشکەش بـە کوڕێک بکە
کە زمان پیس و داوێن پیس نەبێت
هەموو ژەمێک نانو شەقو نەداتێ
تەڵاق و سوێن خواردن بە تەڵاق و شەڕەف لە سەر دەمی نەبێ
ئەمانەش هەمووی
لە چرۆی گەنجێتی
بە دین و دینداری و پەروەردەی مزگەوت و لە خواترسان
ئەبێتە سنەوبەرێکی هەمیشە سەوز و تەڕ لە پـەنای یەک دا
ئەحەسێنەوانێ
بە ئیزن الله جل جلاله

# (٤٩)

ئــــازیــزی دڵــمــ
تــۆ کە نـــاتــوانـی
خــودا ببـیـنـیـت
چــۆن دەتــوانـــی
وەهــا ئــاســان
حـیـکـمـەتـی خــوا
لـە پــشـت ڕووداوەکـانــەوە ببـیـنـی و
لـێـــیـان تـێ بـگەیــت
پــەلـە مــەکــە خــۆی بــە تـێـپـەڕبــونـی کـات
تــێــت دەگــەیــەنــێــت
ئــارامــت هــەبــێـت ... خــەندە بــکــە



## (٥٠)

نـازانم و ئاگاداری بارودۆخی حاڵ و ژیانو گیانو دڵو نیم
چەنەم هەینی یە...؟
تۆ ئازار ئەچێژی جا لە ماڵەوەی یانیش نەخۆشخانەکان
تۆ ئەناڵێنی بە ئازاری سیحر و چاونەفەس
ڕوخسارو ژاکاوە
تۆ شەوو ڕۆژت لێ بوەتە سجنێکی ئەبەدی
تۆ فرمێسک لە چاوانو وشک ناکات
تۆ خەم و دڵتەنگی بوەتە ژەمێکی سەرەکیت
تۆ لە تەنگانەو ناڕەحەتیەکی
دەروچونت لێی نیەو دەرگایەکانی دونیات لەسەر داخراوە
بەڵام لە بیرت بێ و شەیتان زەفەرو پێ نەبات



# (٥١)

جـەدۆلێکی سێ مانگی دانێ
یانیش زەرفێک دروست بکە و ناوی بنێ
زەڕفی شیفا و بەرەکەت
یانیش دەغیلەیەک دانێ لە بری پارە
با پڕ بێت لە دەستنوسی خۆو
بە ناونیشانی وەڕەقەی شیفا و بەرەکەت
لە سێ مانگی کۆتای ساڵی ٢٠٢٢
مانگی دە ، مانگی یانزە ، مانگی دوانزە
سێ ژەممە
هاوشێوەی ژەمی بەیانیان و نیوەڕوان و شەوان
کە خواردن ئەخۆی بۆ برسێتی و مەعیدە نازی هەڵەگری
ئاواش سێ ژەممی شیرینی فەڕحانی ئیمانی
بەیانیان دوای نیوەڕوان شەوان کە هەر زۆر درێژە مەودای کاتی
خوێندنی سورە البقرە بکە ئیجباری و ئەرکی سەرەکی سەرشانو
بۆ ساکین بون و شیفابەخشی
دڵ و ڕۆح و جەستەو

## (٥٢)

ژیان بێ خۆشەویستی و عەشق و زەواج ئەبێت ....
ئەمما بە بێ ( ڕەوشت و شەڕەف ) نابێت !!!
قەت نزیک تین و گەرمی و دوکەڵی ئاگر کەوتویتەوە؟
دەستو بەر گڕی مۆم و چەرخ کەوتوە ؟
یان قڕچی ڕۆن یاوەتی لە دەستو؟ دەی هەستو چۆنە
لە ناو گێژاوی هەواو نەفس و ئارەزووی حەرام بمریت و تەوبەو نەکردبێ
ئاگری دۆزەخ جەستەو بسوتێنێ ؟
چاتی حەرام و خۆشەویستی بە ڕووکەش شیرین
لە ناوەڕۆک ئاگر و ژەهر شەو تا بەیانی بەس بمزانیا باسی چی ئەکەن؟؟؟
لەژورێ تاریک لە ژێر چاودێری خوای گەورە شەڕو ڕاگەیاندوە
لەگەڵ قەدرِی خوا دڵی شەیتانو خۆش کردوە
دوور لە چاوی دایک و باوک و خوش و برات
لەگەڵ کوڕێکی بێگانەی نەناس بە حساب دڵو پێشکەشی کردوە
کێ ؟؟؟ گورگێکی برسی  ئارەزوو گڵاو هاکا بلۆکی کردی
هاکا بە ڕسمەکانو هەڕەشەی لێکردی ...
هاکا دیداری ویست و دواتر پاکێتی و ڕەوشتی شکاندی و تکاندی
وەڵامت چی ئەبێ ؟؟ چی جوابی خوای گەورە ئەدەیتەوە

(٥٣)

ئەو تەنگانە و دڵتەنگی و سجنە دەرونی و ڕۆحیەی
تۆی تێدای
وا هەست ئەکەی گیرۆدە بوی
دونیات لێ هاتۆتەوە یەک
کێ ناڵێت
موژدەی خێر نیە بۆ تۆ
کێ ناڵێت گەرمەی ڕزگاربونت نیە لە جەرگ بڕتین
کارەسات و قورسترین دۆخ
لەم دۆخەی ئێستەت !!!
سەیری مانگ ئەکەی
قەت لە ژێر هەوری ڕەش نامێنێتەوانێ ...!
بە ئیزنی ڕب العالمین
تۆیش و ئازارەکەیشت
ئەگەنە مەنزڵی شیفا
تۆیش و تەنگانەت و سجنیەکە
ئەگەنە مەنزڵی حەسانەوە و ساکینبون
ئازادبون

# (٥٤)

بە ئیزنی میهرەبانی هەموو جیهان
شەوێ هێت ...
شیلەی خۆشبەختی و شیفا ئەمژی
شیلەی ڕزگاربون و حەسانەوە ئەمژی
چەشنی جوانی خەونەکانت
مەست ئەبی
مەست ئەبی لەنێو نزایی قبوڵ کراوت دا لەنێو گریانی خۆشی چاوت دا
بۆچی ...؟
چونەکە تەواو
فەرمان و ویستی خوا هاتۆتە جێ
لەسەرو هەموو ویستەکان
دڵی بەندەیەکی لاوازی بێ دەسەڵاتی
بێ موڕاد چەشنی پەپولە ئەدات لە شەققەی باڵ
لە ژێر ڕەحمەت و کن فیکونی
ئیلاهـی دا
لە قەدەڕێکەوە ئەچێ و ئەفڕێ بۆ قەدەڕێکی تر ...

## (٥٥)

لە نیوە شەوی پاییزێک
کەسێ ناخەوێ
خەوی لێ تۆراوە
ڕەنگی هەڵبزرکاوە
نازانێ ڕێگەی ڕزگاربون لە کوێیەوەیە ...؟
چاوی پڕ فرمێسکی
ئەبڕێتە ئاسمان
لەو دڵە هەڵقرچاو قاژ قاژەیەوە
ئەڵێ یـااااڕب
فریاوم بکەوە یـــاااڕب
جوندییەکانی خۆو نازڵ بکە بۆ گەیاندنم بە ئامانجی مەبەست ...



## (٥٦)

بەشێکی کەناڵەکان
رووماڵی خۆرگیرانەکەیان کرد
مەڕاسیم نوێژەکەیان گواستەوە
گفتوگۆی شەرعی و زانستی تایبەت کرا
ئێستەش بەپەلە ئەنوسن
دیاردەی خۆرگیران کۆتایی هات
وا وەیلا بۆ ئەو ساتەی
ئیتر تەواو هیچ مەجالێک نابێ بۆ ڕووماڵ و نوێژ و پەلە نوسین
بۆ کۆتای هاتن بە خۆرگیران
وای ڕۆژە سامناکەکە #هێت
چاوەکان ئەبلەق ئەبن
ئەو ڕۆژەی خوای گەورە وەعدی هاتنی داوە
خۆر و مانگ ڕووناکیان نامێنێ
ئاسمان ئەپێچرێتەوە
ئەستێرەکان هەڵدەورەن
زرمە گەورە هێت

## (٥٧)

ئەو کش و مات و بێ دەنگیە چیە ...؟
باڵ ئەکێشێ بە سەر ماڵ دا
کاتێک یەکێک لە ئەندامانی خێزان نەخۆش ئەکەوێ
یارب شیفای خێر نازڵ بکەی
بۆ جەستەی ئەو نەخۆشانەی لە نێو ماڵەکانن و نەخۆشخانەکانن
ئەناڵێنن بە دەست ئازارەوە ...



# (٥٨)

دایکم هەمیشە
ئەڵێ : کچم
خوا پاک نادات بە دەم پیسەوە
دەسا یاربی
پیسی و خراپی و بەڵا
لە سەر ڕێگە و ژینی
خۆم و هەموو موسڵمانێك دوور بخەیتەوانێ



## (٥٩)

پەیامێک بۆ ئەو کەسانەیی تعلیق لە سینگڵەکان ئەدەن ...
واللهـ سینگڵ بە کچیش و کوڕیشەوە
چاومان لە سەر (دیندار و ئیماندارەکانە)
ئەوانیش ئەتوانن کەپڵیان هەبێت ڕابوێرن و گەنجێتی خۆیان بکەن
دەست گەرم بکەنەوە شەو تا بەیانی
قسە و چاتی حەرام بۆ یەکتری بکەن بەڵێنی درۆ و بدەن بە یەکتر
لە پێناو ئارەزوویەکی کورتی ڕۆمانسی چێژ بدەنە یەکتری
لە ڕێگەی مۆبایلێک لە ژێر سەقفی ماڵ باوکیان دا
خیانەت لە دینەکەیان و
پاشان دایک و باوکیان بکەن و سەری بنەماڵەیان شۆڕ بکەن
با بزانن ئەو سینگڵانە ئارامیان گرتووە لەسەر ئارەزوو خۆشەویستی ئاگری
حەرام خۆیان هەڵگرتوە بۆ ئەو کەسەی خوای گەورە لە قەدەری نوسیون
بۆ ئەوەی تاسەیان بشکێت لە کەژاوەو شیرین بەیەک گەیشتنی حەڵاڵی
ناچن ئاوی سوێری خۆشەویستی حەرام بخۆنەوە کە قەت تینویەتیان
ناشکێت خۆشەویستیەکی نادیار و ئاسنی سارد کوتین کە
دەورە دراو بە ئاگر و دڕک

## (٦٠)

بـەو عـەبـا ڕەشەوە
هێندە دڵبەر بێت ...
ویستی خوای لێ بێت و
زەواج بکات ...
بۆ حەڵاڵەکەی
خۆی بڕازێنێتەوانێ ...
دڵـو بەرایی نایەت
مـاشاءالله تبارک الله
نەڵێیت بۆی ...



## (٦١)

ئەڵێم هـ
یاخوا پیرۆزتان بێت و
حەساوە و سەربەرز و عاقیبەت خێری دونیا و قیامەت بن
لە سەر نانی تاجی ئەڵماسی دینداری
هیدایەتتان لێ بەرەکەت و
دامەزراویتان لێ گوڵستان
ئەی گەنجانی خۆپارێز و بۆ خوا سوڵحاو
دەست و چاوو دەم و داوێن و نەفەس پـا
لەم زەمەنی فیتنە و شوێنکەوتەی هەواو نەفس و ئارەزووی حەرام پارەو
کاسبی حەرام و سوو ڕیبا و
چون بە دوای شەڕەف و ئافرەت و چاتی ئاگر و سەرشۆڕبونەدا



# (٦٢)

ئاخۆ ئەبێ
هەستی ئەو دڵە شکاو
جەستە بە ئازارانە چۆن بێت ...؟ کاتێک خوای گەورە
بە قودڕەتی خۆی
سارێژی برینەکانیان ئەکات و
شیفایان بە سەرا ئەبارێنێ ..
مەبەستمان لە شیفا
تەنها ئازاری جەستەیی نیە
ئازاری ڕۆحی و مێشک و نەفسیشە !
هەستی کرێکارێک چۆنە ...؟
لە دوای تەواو بونی کارەکەی لەبەر سێبەرێک پشو دەدات وپەرداخێک
ئاوی سارد دەخواتەوە



# (٦٣)

ئەمشەوی بارانە
ئەبێ چەن هەناسە سارد هەبن ...؟
فرمێسکە گەرمەکانیان
بە نمەی باران
تێکەڵ ئەکەن و
ئەیپرژێنن بە
گۆنای ساردو تەزیویان ...
یـارب
تەنها تۆ ئاگای
بە حاڵی ئەو هەناسە سارد و تەزیوانە
بە ڕەحمی خۆو
گەرمی سۆز و میهرەبانی خۆو ...
هەناسەی خۆشبەختی و حەسانەوە
بکەیتەوە سینەیان ...

## (٦٤)

ئەزانی تۆی بەندە
جگە چوار فەڕزەکە
جێژوانێکی تایبەتتری زۆر سارد و خۆشت هەیە
لەو خەوە خۆش و جێگە نەرم و گەرمە
خۆو مەحرورم ئەکەیت
بۆ دوو ڕکعات سوننەتی پێش نوێژی بەیانیان و
خودی نوێژە فەڕزەکەی بەیانیان
ئەچیتە دیداری خالقی ئاسمانەکان و زەوی و هەموو کەون
با ئاوی ساردی دەستنوێژەکەو
تێکەڵ بۆنی خۆشی عەتر و میسک بکەیت
با شەیتان زەلیلتر بکەیت
پیرۆزت بێت
ئەو گەرم بونەوە دڵبەرەی
دوای نوێژی بەیانی کە ئەیچێژیت ...
تەنها ئەو کەسانە لێم تێدەگەن
کە توشی بون

## (٦٥)

شەوی هەینیە و
دڵانێک
هێندە دڵخۆشن حەزەکەن بدەن لە شەققەی بـاڵ و بفڕن
کوخێک ... خێمەیەک ... ژورێکیان
لێ بوەتە کۆشک
دڵانێکیش
هێندە بێ ئۆقرە و دڵتەنگن
گەر لە کۆشک بن
گوێت لە شکان و وردبونی دڵ و جەستەیانە
فرمێسکیان مرواری ئاسا
لە سەر گۆنایان ئەبریسکێتەوانێ



## (٦٦)

ئەی ئەو کەسەی
چاوت ئەچێتە سەر ئەم دێڕە
ڕب العالمین
گریانی خۆشی ...
گەیشتن بە خەونی حەڵاڵو
لە چاوانو ببارێنێ ...



## (٦٧)

نهێنیەکو پێ بڵێم
خوای گەورە ئەوخاتە نێو تاقیکردنەوەیی ئازار و دڵتەنگی
وە بە جۆرێک دەرگەی ڕزگاربون و
دڵخۆشیو لێ ئەکاتەوە ...
ئەسڵەن بە خەتەڕەی دڵیشودا نەهاتوە
جگە سوجدەی شوکر و گریان
هیچی دیکە ناکەی



## (٦٨)

چ هەستێکە ..؟
شەوی باران و لێزمەو هەورە بروسکە بێ و ...
تێر بیت لە ئارامی و شیفا و حەسانەوە
چ هەستێکە ...؟
سوننەتی نوێژی بەیانی و
نوێژە فەڕزەکەی بەیانی
تێکەڵ
بۆن و بەرامەی دەنگی باران و هەورە گرمە بێت ...



## (٦٩)

وای لەو شەوەی
یەکەمین شەوی نێو گۆڕمان ئەبێ ...
بە تەنیا ئیتر ئامێری ڕووناکیت لا نیە
ئیتر سەعاتی مۆبایلەکەو بۆ نوێژی بەیانیو ئامادە ناکەیت
یارب وەڵامدانەوەی فریشتەکانی نێو گۆڕمان لەسەر ئاسان بکەی
گۆڕمان بۆ بۆ فراوان بکەیت
بۆمان بکەیت لە باخێک بێت لەباخەکانی بەهەشت



## (٧٠)

بە الله قەسەم
خوای گەورە جێی نەهێشتوویت
ئیهمالیشی نەکردوویت
تەنها بینەری ئەندازەی ئارام گری و شوکرانەکەتە
دڕک چوە بە دەستودا ؟
کاتێک ویستوتە بۆنی گوڵێک بکەی
هەتا بۆنە خۆشەکەی بچێتە سینە و لوت و مێشکو ...؟
بۆن خۆشی گوڵـەکە
ئازاری دڕکەکەی لەسەر کەم کردوویت !
دەی ئەو دڵتەنگی و ناڕەحەتیانەی
تووشت هاتون
وەک ئەو ئازاری دڕکە وایە ...
ئەمما بیر لە بۆن خۆشی قەدەری سەرسوڕهێنەری ئیلاهی بکەوە
بزانە چۆن سینەو مێشکو
پڕ پڕ لە بۆن خۆشی ڕەحمەت و بەرەکەت ئەکات ...

## (٧١)

گریانی خۆشی ....
ئەو یاریزانانە و بینیوە ...
چۆن ئەگرین
کاتێ یاریەکە ئەبەنەوانێ ...
یانیش
ئەو دایک و باوکانەو دیوە
کە بۆ یەکەم جار دەبنە خاوەن منداڵ
ئەو جەستە و چاوو دڵانەو
بینیوە کاتێ هەواڵێکی خۆش ئەبیستن
چۆن ئەگرین ...
گریان هەنسک و پێکەنینیان تێکەڵ ئەبێ ...
چەشنی تێکەڵ بونی مرواری و ڕوبار فرمێسکیان بریسکە ئەدات ...
دەی یاربی خوێنەرانی ئەم کتێبەش...
بگەنە ئەو گریان و موقیفە خۆشیە
دڵڕفێنە وەصف نەکراوەی ...
کە بە درێژایی ڕۆژوو شەوەکە
هیچ خواردنێکو بۆ ناخورێت .

## (٧٢)

ئەم دوای بانگی عیشایەی
کە چەن عیشایەکمان ماوە لە ساڵی ٢٠٢٢
بۆ دڵ و جەستە و سینەی تەنگ و ئازاری
هەر یەکێکتان
الله بۆتانی بە خێر بگێڕێ و
بیکاتە عیشای هەینی
قبوڵبونی نزا و
دڵخۆشی و فەڕەحی و شیفا و ...
توانەوەی بەستەڵەکی چاوەڕوانیەکانتان ...



# (٧٣)

هێندەی ئەو تەمەی شاری سلێمانی
داپۆشیوە ...
دڵانێک ...جەستانێک ...نەفسانێک هەن
تەمی ئازار و تەمی خەم ...
تەمی دڵتەنگی ...
دایپۆشیون ...
یارب العالمین
بە کۆتا هاتنی ساڵی ٢٠٢٢
تەمەکانیان بڕەوێنیتەوە ...
بە سارێژی شیفای خۆو
دایانپۆشی ...
بە قودڕەتی ڕەحمان و میهری خۆو
دایانپۆشی ...



## (٧٤)

وەسیەتێک

لەم کۆتا ساتانەی ٢٠٢٢

قەت دەستبەرداری خوێندنی سورە البقرە مەبە

مەسەلەن کەسو دیوە ...؟

بێ هەناسە بژی ...

ئەها هەنێ نەخۆش پێویستیان بە ئامێری هەناسەدانی دەستکردە

سورە البقرە

هەناسەیەکی سوکناییە

بۆ سەراپای جەستەی شەکەت و ماندوو بێ قەڕاڕ و

قەتیش ئاوێکیان شەربەت یان شیر و نیسکافە مەخۆوە

بێ ئەوەی چەن ئایەتێکی پیرۆز

بەسەرا نەخوێنیت...



## (٧٥)

ئەو کچانەتان دیوە ...؟
کە وردوخاش بون ئەو کوڕانەتان دیوە ...
بون بە بەفری تواوە ئەو ژنو مێردانەتان دیوە  لانەیان لێ تێکچوە
ئەو ژنانەتان دیوە حەملەکەیان داناوە مباشر مناڵەکەیان
ناردۆتەوە بۆ ماڵە خەزوریان
بەشێکی ئەو بەسەرهاتە ڕاستەقینانە
هۆکارەکەی تەنها و تەنها چاوو نەفەس و
سیحرە کە ئەوانەیی دورن لە ئیسلام خۆیان پێو خەریک کردووە
جا بزانن هەمووی بە ویستی الله یە کە الله ویستی لێ نەبێ کەس ناتوانێ
ئازارت بدات بەڵام ئەو ئازارەش تاقیکردنەوەیە بۆتۆ
سەبر بگری و پشت بە الله ببەستی لێی دەردەچی ناشکوربی و بێ ئومێد
بیت دەڕوخێی زاڵ دەبن بەسەرتا ئەدۆڕێی
یـــارب  تۆڵەیان بکەوە
هیچ پەردەیەک نیە لە نێوان کەسی مەزڵوم و زاتی خۆت
یـــارب  هەر لەم دونیا حەقیان بکەوە
سیحرەکانیان بەتاڵ بکەوە یحرەکان بگەڕێنیتەوانێ بۆ سبکارەکان

## (٧٦)

ئەو شەوەت دی
باران ئەباری و ...هەورەگرمە بوو
کارەبا نەبو خەویشت لێ تۆرابو
لە تاو ئازار و دڵتەنگی و خەفەت ...
بە ئیزنی الله تعالی
شەوی حەسانەوە و خۆشبەختیشو هێت ...
وا ئەزانێ هیچ تاڵیو نەچەشتووە



## (٧٧)

ئەی ئەوکەسەی
لەگەڵ ئەم جەوە ساردە تەزیوەی زستان
بەهۆی زوڵم و ناحەقی کەسێکی دیاریکراو بەس خۆی ئاشکرا ناکات
هەناسە و سینەو تەزیوە و سارد سارد بوە
یاربی خوای گەورە
بە زووترین کات و کەمترین ماوە
بێتە جواب
تۆڵەو بسێنێ
بە جوندی گورزوەشێنی پڕ ئازار
لە بارودۆخی ئێستەی تۆ
سببکارەکەو هەناسە ساردتر بێت
ئەسڵەن تۆی بیری نەمێنێ
لە تاو خەفەت و ئازاری خۆی

## (٧٧)

ئەی ئەو کەسەی
نەخۆشیت
جا نەخۆشی سیحر و چاونەفەسیت
لە نێو ماڵ و
ڕوقیەی شەرعی و مامۆستا بەڕێزەکانی
کە تایبەتن بە خوێندنی ڕوقیەی شەرعی و چارەسەری شەرعی
یانیش نەخۆشی نێو نەخۆشخانە و دکتۆرە بەڕێزەکانی
ئاوی باراناو
لە دەست خۆتان مەدەن
سوراحیەک یان
سەتڵێک بچوک
با ئاوی بارانی تێبچێ ...
دواتر زیکر و قورئانی لە سەر بخوێنن
بە نیەتی شیفا لێی بخۆنەوە ...

## (٧٩)

نازانم ئێستە لە کوێیت و
پیشەو چیە
لەماڵیت
یانیش لە دەرەوەی ماڵ
چەنێک سەرماو بوە
چەنێک تەزیویت
ڕب العالمین
چەشنی ئەو تەزین و سەرمایە
ئاواش
حەلاوەت و شیرینی هیدایەت و بەرەکەت و شیفا و حەڵاڵیو
پیٚ بچێژێت ...



## (٨٠)

بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر
قورئانی نەخوێند
حاڵی تێکچوو
نەیئەزانی چیەتی
ئەوت کەسێکی نوێژنەکەری لادینە
وا وەیلا ... خاک بەسەر و تیاچون
بۆ ئەو کەسانەی
بە درێژایی تەمەنیان
نەک سورەتێکی قورئان ناخوێنن
سوجدەیەکیش نابەن



## (٨١)

ێستە سەر ڕێژ ئەکەی ...
بە ئازار و ناڵاندن و دڵتەنگی و بێ قەڕاڕی
خوای گەورە
خۆی ساڕێژو ئەکات
بە ساڕێژێک لە عەقڵ بەدەر بێ
قەڕەبوت دەکاتەوە
بە قەڕەبویەک ...
نازانی چی بڵێی ...
تەنها ئەگری و ئەڵێی خوایە شەرمەزارم
وامزانی جێت هێشتوم



## (٨٢)

مردنی لەناکاو زۆر بوە
واتە مردنێک لەسەر لەشی ساغ
کە هیچ نەخۆش نیت
یارب العالمین
عاقیبەت خێرمان بکەیت
مردنێک بێ ڕووی گەڕانەوەمان هەبێت
مردنێک بێ تامەزرۆی نێو گۆڕ بین
چونکە لە نێو گۆڕ جێگەی خۆمان پیشان ئەدرێ
خوایە بەهەشت بێ ئەو جێگایی
ئەبێتە ماڵی ئێمە



## (٨٣)

وا خەیاڵ بکە
نامەیەکو بۆ دێت
لە نوێژی بەیانی تایبەتە بە تۆ
ئەڵێ هەر کەسێک لە نوێژ ئامادە نەبێت
نامەکەی هەڵدەوەشێتەوانێ
تۆش بێ ئاگایانە
خەوتویت و ئامادەی نوێژ نابێت و
ناوت لە لیستی نوێژکارانی بەیانی نانوسرێت ...
کارەساتێ جەرگبڕە وانیە ...؟!



## (٨٤)

قەت تووشی قەلەقی و دڵەڕاوکێ بویت
قەت ئەو شەوانەو لێ بوەتە ساڵ
لە تاو ئازار و دڵتەنگی
قەت ئەو بانگی بەیانیانە لێ ڕۆیشتوە
تۆیش بە لەرزینی جەستەو نوێژو کردووە
دەقیقەن ڕێک ئاوا
خوای گەورە
بە لوتف و کەڕەم و ڕەحمی بێ سنوری خۆی
قەڕەبوی ترپە ترپەی دڵو بکاتەوانێ
کە لەو ساتانەدا لێدانی ترپەی دڵو بوە



# (٨٥)

ئەی ئەو کەسەی زوڵمت کردووە
لە کەسێک
ژیانیو گیانیو تێکداوە
وەک نامەردییەکەو کردووە
خۆ ناتوانی ڕووبەرووی بیتەوە
بڵێی گەردنم ئازاد بکە
هەم پێش مردنو با حەقی کەسو لە گەردن نەمێنێ
هەمیش حیساب و کیتاب نەکەوێتە پردەکەی سیراط
بڕۆ داوایی گەردن ئازایی لێ بکە
بڵێ من
لە فلانە ساڵ و ڕۆژ ئەو زوڵمەم لێکردووی
ژیانم تاڵ کردوویت
تەنها داوای گەردن ئازادی لێ بکە

## (٨٦)

وای لەو شەوەی
دڵ خۆش ئەبێ ...
چاو ئەبریسکێتەوە لە فرمێسکی خۆشی
جەستەو ئەلەرزێ لە شۆک بوندا
وای لەو ساتەی ئەگەی بە چاوەڕوانیەکەو ...
ئەمە تەنها خەیاڵێکە ...
نوسینێکە لە ڕێگەی کیبۆردەوە
خۆش بەحاڵی ئەوەی چەشتیو ...ئەیچێژێ ...



## (٨٧)

تایبەت بە گەنجان برایانی بەڕێز
هاوسەرگیری لەگەڵ کچێک بکە
جوانی و جەستەی ناسکی
نمایش نەکات بۆ هەموو نامەحرەمێک
بیانوت پێ نەگرێ
ئاڵتونو زۆر پێ نەکات
شوێن مۆدێل و بۆتۆکس و فیلەر تەجمیل نەکەوێ
چاولێکەری و قسەی چواردەور کاری لێ نەکات
کیسە جیایی نەکات لەگەڵت
بە دوای فیلم و گۆرانی نەگەڕێت لە سایتەکان
پیس و پۆخڵ و ئیهمال نەبێت
دەم پاک و دەست پاک و داوێن پاک بێ
فیتنەی و دووزمانی نەکات
ئەمەش تەنها لە کچی لە خواترس و باڵاپۆشی ڕاستەقینەو بۆ خوا سوڵحاو دەست ئەکەوێ
ئەستەمیش دەست ئەکەوێ
لەم سەردەمی فیتنەو ئارەزوواتە دا

## (٨٨)

ئەڵێم
قەت شەوان
بیرو لە یەکەم شەوی نێو گۆڕت کردوەتەوانێ؟
چۆن شەوانێک هەبوە
بیرو کردوەتەوانێ ...
لە شەوی شیفا
شەوی مارە کردن
شەوی کۆبونەوەی خێزانی و
شەوی جەژنان



## (٨٩)

ئەزانی تۆی کوڕی گەنج
کاتێک ڕێز لە کچێک ئەگریت و نابیتە هۆکاری ئازاردان و یاری کردن بە هەستی و ڕوخاندنی
پیاویت بە مانای کەلیمە
کاتێک کچێک ئەبینی و سەر دائەخەیت و ڕێگەی بۆ چۆڵ ئەکەیت پیاویت
هەڕەشەی لێ ناکەیت و ئیهانەی ناکەیت و نابیتە مەترسی بۆ سەر ژیانی
پیاویت دینداری و پیاوبون و ڕەوشت بەرزی و ڕاستگۆیت و دەست و دەم و داوێن پاکیت ...
لەم سەردەمی ئاگری فیتنەو پارەو ئافرەت و ئارەزواتەدا
ئەڵماس و گەنجینەی لوتکەی گەنجیەکەتە
ئەو گەنجیەی لە پێناوی الله
ئارەزوەکانو خستۆتە ژێر پێت
ئەو گەنجیەی
ئەشێ کچێکی دینداری باڵاپۆش
بە نهێنی داوات بکات لای خوای گەورەبڵێت : خوایەگیان گەنجێ دینداری خواناس لەو شێوە بکەیتە حەڵاڵم

## (٩٠)

نیعمەتەکانیش بریندار ئەکرێن و ئەکوژرێن و ئەمرن ...
-چـۆن ... ؟
چ تیری چاو و هەناسە پیسێک
چ تیر قوڕەتێک
چ چاوێ ئاگرین
بیدات لە کەروێشک و تەیر و ئەسپ و سمۆرە
مرداری ئەکاتەوانێ
بیدات لە دڵ و جەستە و ڕوخساری ئینسان
یان نەخۆشی ئەکات و سیس و لاواز و ڕەنگ زەردی ئەکات
ئەیخاتە سەر جێگە
یانیش ئەیخاتە نێو گۆڕ
یـــارب ئەها پەناو پێ ئەگرم
لـە شەڕ و خراپەی ئەو هەناسە و چاوە ئاگرین و پیسانە
پەناو پێ ئەگرم لە شەڕو پیسی و خراپەی
ئەو جۆرە سەیر کردنانە
أعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان وهامة ، ومن كل عين لامة

# (٩١)

لە نێوانی رووماڵکردنی بومەلەرزەکەی ئەمڕۆ و
بومەلەرزەکە قیامەت دا
تەواوی کەناڵەکان ورۆژنامەنوسەکان
تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان
پڕ بوە لە هەواڵی کارەساتی بومەلەرزەکەی شارە کوردیەکانی باکور و ڕۆژئاوا
ئەو کاتەی بومەلەرزەکەی قیامەت ڕوو ئەدات
مەجالی هیچ شتێک و ڕووماڵ کردنێک نامێنێ
بۆیە خۆت ئامادە بکە بۆ ئەو ڕۆژە



# (٩٢)

قودرەتی ئیلاهی
باڵەخانەکان تەختی زەوی ئەکات ...
لە ئاسمان قەدەرێک بە ڕێوە بو
لە زەویش کەسەکان خەوتبون و پلانەکانیان داڕشتبو ...
ماڵێک چاوەڕێی تخروجی مناڵی بو
ماڵێک چاوەڕێی شیفای نەخۆشی بو
ماڵێک چاوەڕێی مارەبڕین بوو
ماڵێک چاوەڕێی کڕینی خانوو سەیارە بوو
کەسانێک کرێچی بون
کەسانێک هەژار یان دەوڵەمەندبون
نەخۆش و پیرو گەنج و مناڵ ژن و پیاو
دەستگیراندار
ئافرەتی دوو گیان
خوێندکار و مامۆستا و فەرمانبەر هەموو چین و توێژەکان
خەوتبون هێشتا چاوەڕێی بەیانیەکی نوێ بون ...
بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرک و کار و پرۆژەکانیان.

## (٩٣)

یـارب
لەم سەرما و بەفر و بارانەدا ...
تنۆکێک ، مشتێک ، پڕوشەیەک ، تەزینێک
بکەیتە موژدەی خێر
موژدەی نەجات بون لە تەنگانە و ناڕەحەتی و
سوکنا بون بۆ دڵ بە خەمەکان ....



## (٩٤)

کۆتایی ئازار
لە سەرەتای ئازارەکە بەچێژترە ...
ئەسڵەن تروسکە و دەرکەوتنی
یەکەم پەلکەزێڕنیەی شیفا ...
لە خودی ئازارەکە و تاڵی علاجەکان
شیرینترە
الله تعالی
ڕووت لە هەنگوینی شیفای ڕەحمەت بکات



## (٩٥)

ئەی کچ
خۆ تۆ تلیاک و مادەی قاچاغ نیت
بوشارێتەوە لە بنەماڵەکەی
بە دزیەوە بە دەنگی نزم تەلەفۆنو بۆ بکات ...
کوڕیش خۆ پیاو کوژ و چەقۆ وەشێن نیە
ئەیشاریتەوە لە دایک و باوکو
ناوی تۆمار ئەکەی بە کچ !!!
بیخە مێشکە ساویلکە و بچوکەکەو
کوڕێک لەخواترس و مەرد و پیاوانە بو
بە ڕاستی تۆی خۆشبوێت و
هێتە لای باوکو دایکو ئەوخوازێت و
خۆی ئاشکرا ئەکات بۆ بنەماڵەکەو
ناوشارێتەوە
لەم بن دار بۆ ئەو بن دار

(٩٦)

گوڵی سور و ورچ
جلی سور و ڕۆمانسیەت و
دیاریەکان
هەڵبگرن
بۆ دوای حەڵاڵبونتان
ئاخر چۆن لە تۆوی
دڕک و ئاگر
چاوەڕێی بەرهەم ئەکرێت ...؟
لە ڕۆژی بەناو خۆشەویستی
جگە داخ و حەسرەت و پەشیمانی و خەفەت و جێهێشتن
هیچ چاوەڕێ ناکرێت



## (٩٧)

دەستەکان پڕ نزا بێ
کارو کاسبیو خواردن و خواردنەوە حەڵاڵ بێ
لە لایەک دڵ
لە لایەک چاوەکانیش
لە ئاست حەرام داخراو بن
قاچەکانیش هەنگاویان تەنها بۆ مزگەوت و کاری خێر بێت
ئەبێ چی سەوزیەکی پڕ بەرەکەت بڕوێت ...
لە قەدەڕی ئیلاهی دا
لە چارەنوسی تۆی خوێنەر



# (٩٨)

زۆرینەی پۆستمان بۆ خوشکان بوە

ئەمشەو بۆ برایانە تایبەت

گەنجیت وا ئەزانی ئەبێ بە پیری تەوبە بکەیت ...؟

مردنو نزیکە بەس پێم بڵێن

چی چێژ و خۆشیەکی تێدایە ...؟ زنجیر لە دەست و مل ئەکەی ؟

تاتۆ ئەکەی؟ مەشروب ئەخۆیتەوە قومارِ ئەکەی جگەرە ئەکێشی

بۆنی تەپڵەکو لێ هێت خۆو هەڵکێشی لە عەترەکانی پاریس

ئەی ئەم برۆ چاک کردن و ساسۆکیە؟ چیە پانتۆڵی تەسک جلی تەسک

بەس پێم بڵێن چی ڕێگرە لە تەوبەت لە چون بۆ مزگەوت و

نوێژە جەماعەتەکان و بەشداری وتاری هەینی و نوێژەکەی

واللەی قەینا سەیری یاری دوو گۆڵی ئەکەی

ئەگەر ئەچی بۆ قاعە و یاری وەرزشیەکان

قەینا جێڵ بۆ قژو بەکارئەهێنی بۆنی خۆش بەکارئەهێنی

قەینا مستیلە بە ڕێگە سوننەتەکە بەکارهێنی

بەس لەگەڵ ئەو شتە باشانەدا

پیاو و مەرد بە گەنجێکی بۆ خواسوڵحاو بە گەنجێکی لە خواترس بە

گەنجێک بە بۆنی ئیمان و ئیسلامەتی و دینداریو لێ بێت

## (٩٩)

نـــاڕازیت لە ژیانو ...؟
ناشوکری بەرامبەر نیعمەتەکان الله تعالی
دوو سەعاتێ
بڕۆ بۆ سەردان نەخۆشخانەکانی طەواڕی و هیوا و نانەکەلی و
نەخۆشخانەکانی ئیمرجنسێی سوتاویی
سەعاتێکێش بڕۆ بۆ گۆڕستان
یـــارب
شیفای تەواوی ئەو نەخۆشانە بدەیت
کە داغڵی نەخۆشخانەکان کراون
لە مردووەکانیش خۆش بیت ...



## (١٠٠)

عاشقانە بۆ فەرمانی الله تعالی
ئەم مانگی شەعبانە
بە تۆوی خەون
تۆوی ئازار
تۆوی دڵتەنگی
ئەچمە نێو مێرگی بەفەڕی مانگی ڕەمەزانی نورانی
هەتا لەو ٢٩ ڕۆژەدا چەکەرە ئەکات
لە ڕۆژی عەرەفە و جەژنیشدا
لە سێبەری خەونەکەدا ئەحەسێمەوە
لە سێبەری شیفای الله دا
ئازارم سارێژ ئەبێ
دڵتەنگیشم ئەبێتە سەکینەت ان شاء الله



(١٠١)

مەسەلەن
قەدەڕی خوای پەروەردگار
لەم ڕەمەزانی ساڵی١٤٤٤ کۆچیەدا
دڵت شاد و
چاوت ڕۆشن بکات
یارب
بیبەخشە بە منیش و هەموو ئیماندارێك



# (١٠٢)

چ فەزڵ و بەخششێکە
الله تعالی
تەمەنو پێ ئەبەخشێتەوانێ و
شادو ئەکاتەوانێ
بە ڕەحمەت و شەو و ڕۆژە موبارەک و بۆنە دڵڕفێنەکەی ڕەمەزانی دڵبەر
وای لەو شادبونەی نێو قیامەتیش
بە پێغەمبەری خوا صلي الله عليه وسلم
اللَّهُمَّ صَلِّ عَلى نَبِيِّنَا مُحَمَّد وَعَلى آله وَصَحبِه وَسَلّم
جمعة مباركة



## (١٠٣)

یـارب العالمین
لەم ئێوارەی پیرۆزی هەینی شەعبانەدا
داوای مانگی ڕەمەزانێکی
پڕ دڵنەوایی و مژدەی شیفا و
ڕەمەزانێکی پڕ قەڕەبووت لێ دەکەم
بۆ هەموو دەردەداران و ئازاران

بۆ اللَّهُمَّ صَلِّى عَلى نَبيِّنَا مُحَمَّد وَعَلى آله وَصَحبِه وَسَلّم
جمعة مباركة ﷺ



## (١٠٤)

تایبەت بە خوشکە سفورەکان
باڵاپۆشی لایەنە شەرعیەکەی ڕوون کراوەتەوە و جێگر بوە
باسی دونیا ئەکەم
ئەزانی تۆ
بێ بەشیت لە کەژاوەی تایبەتمەندی خۆو
کەژاوەکەت کردووە بە سیستمی فری
بۆ هەموو چاوە نامەحرەمەکان
کەژاوەت ئەبێ چەشنی کەژاوەی بوکێنی بـێت
تەنها حەڵاڵت بوبینێ و مەستت ببێت !
ئەزانی تۆ
بەم سفوری و خۆ ڕازاندنەوەیت
هیچ چێژێکو بۆ حەڵاڵی خۆو نەهێشتۆتەوە !
خۆو کردووە بە سفرەیەک
هەموو چاوێک لێت ئەخوات و تێریش نابن !

## (١٠٥)

یاالله نازانم

حیکمەتی ئەم شەوە پیرۆزە و باران و هەورە تریشقە چیە کۆبونەتەوە پێکەوە

یا الله خۆت بۆمانی بگێڕە

بە بەرەکەتی شیفا و

لاچونی بەڵا و موصیبەتی دینی و دونیایی



## (١٠٦)

شەویٚ هێت
ناچیتە جێگە گەرم و نەرمەکەت
سەرین و بەتانیو نیە
هەڵناسی بۆ نوێژی بەیانی
ئەزانی لە کوێی ...؟!
لە نێو گۆڕدای
کفنێکی سپی جل و بەتانیتە
خۆڵکراوە بەسەر جەستەودا
یارب
ئەو کاتانەی نێو گۆڕمان بۆ ئاسان بکە
وەک چۆن کارەکانی دونیات ئاسان کردووە



## (١٠٧)

ئەم پۆستە بۆ برایانی دیندارە بە گشتی
بۆ ئەو خوشکانەیشە تەنها لە ماڵەوەن و کەسی نامەحرەم و بێگانەی لێ نیە
ڕەحمەتی اللەتان لێ بێت
لەگەڵ هەر نوێژکردن و قوڕئان خوێندن و تەڕاویحێک
لەم یەکەم پارشێو و یەکەم نوێژی بەیانی و دوو ڕکعات سوننەتەکەی پێشی
بە عەتر و میسکەوە
بچنە حوظروی الله تعالی
خوێندنی قوڕئانی پیرۆز
بەرماڵ و قوڕئانەکەو
میسک و عەتر ڕێژ بێت ...



## (١٠٨)

لە کاتی سەردانیەکت بۆ لای نەخۆشێک یان میوانیەک لە بەرنامەدایە
یانیش دەعوەتێک کراویت
بۆ ئەوەی دەست بەتاڵ نەبێت
لەگەڵ گوڵ و میوە و شیرینی یەکەدا
ئەم دیاری قیامەتیەشتان بیر نەچێت کە قورئانە
چونکە هەتا ئەو لەو قورئانە پیرۆزەدا بخوێنێت
ئەوا تۆش بەشدار ئەبی لەخێرەکەدا
چونکە تۆ بویتە سببی کرانەوە و پیشاندانی ڕێگەی خێر و ئالودەبون بە قورئانی پیرۆز



# (١٠٩)

یـــاااارب
چارەنوسێکی پڕ ئارامی و شیفا
دڵێکی پڕ خۆشەویستی خۆت و
رسول الله ﷺ
قەرەبویەکی بەچێژ
عاقیبەت خێریەکی پڕ ڕوو سپی
بکەیتە نسیبی من و هەموو ئیماندارێك
ئـامین یاالله



## (١١٠)

یـارب
نازانم چی چاوەڕێم دەکات
لە شەوە دڵبەرەکانی قەدری ١٤٤٤ کۆچی
لە جەژنی ڕەمەزان و
دوای جەژن
بەڵام ئێمە گومانی باشمان پێت هەیە
پڕی کەیت لە تەرزەی لێخۆشبون وئازادکراوانی ئاگری دۆزەخ
قەدەرێکی پڕ بەدڵ ڕازی بون



## (١١١)

قەدڕی دڵبەر و هەینی پیرۆزتان
لێ بێتە
شیفای دڵ و سینەو ئازارتان
٢٣ ی ڕەمەزان بێ قەدڕی دڵان بێت
شەوی هەینی بێت باران باری بێت و
سوجدەی شیرین و قوڕئان خوێندن و بۆنی عەتریش
ناکرێت و نابێت و ناگونجێت
دوعای خێر و ڕزگاربون و شیفا
لە بیر بکەن
بۆ نەخۆشان و دەردەداران و
تووشبوانی سیحر و چاونەفەس
نەخۆشخانەکانی هیوا و نانەکەلی

اللَّهُمَّ صَلِّى عَلى نَبِيِّنَا مُحَمَّد وَعَلى آله وَصَحبِه وَسَلّم
جمعة مباركة و ليلة القدر ﷺ

# (١١٢)

یارب العالمین  چۆن پیرۆزی و بەرەکەتی شەوی هەینی
٢٣قەدەری دڵرفێن و
بارانو کۆکردەوانێ
ئاواش دڵی بەندە لاوازەکان
وەڵامی دوعاکانیان و
هاتنەدی ئاوات عاقیبەت خێریان  پێکەوە کۆبکەیتەوانێ

اللَّهُمَّ صَلِّی عَلی نَبِیِّنَا مُحَمَّد وَعَلی آله وَصَحبِهِ وَسَلّم
ﷺ



## (١١٣)

یارب العالمین
هەر کەسێ سیحری لێکراوە
چاونەفەس لێی داوە
ژیانی بوەتە وێرانە و سجنێکی ئەبەدی
ڕوخساری بوەتە مردووی گۆڕستان
خوایە خۆت ڕزگاری بکەیت
خوایە خۆت،شیفای بۆ نازڵ بکەی
خوایە خۆت بێیەتە جواب لەسەری
بەس ئەوانە لێم تێدەگەن
کە،تووشی بون
یان کەسێ نزیکیان تووش بوە



## (١١٤)

خوای پەروەردگار
ئاواتە خێرەکەیی دڵ و
شیفای ئازار و ... سارێژی برینەکەو
یەک بخات ...
لەگەڵ شەوە موبارەکە عەتراوییەکانی قەدەری پڕ لەقەدر و سەکینەت



## (١١٥)

یارب ... یا المجیب ... یا الرزاق ... یا الفتاح
لەم ئێوارەی ٢٩ی ڕەمەزان و
قەدڕی پیرۆز و عەرەفەی ١٤٤٤ کۆچیەدا
یاربی
خوای پەروەردگار
جەژنت بۆ بکاتە دوو جەژن
بە لوتف و کەرەمی خۆی
وەڵامی نزاکانی قەدرو بداتەوە
لە هەر تەنگانەو ئازارو نارەحەتیەکی
خوا ڕزگارو بکات
خەم و پەژارە و دڵتەنگیت لیٚ هەڵگرێت
بگەیت بە شیرینیەکی پڕ خێری بە چێژ
قەرەبوی تەواوی تاڵیەکانو بێت
دەرگەی بەرەکەت و خێر و شادی بەسەرا بکاتەوە
منیش بیٚ بەش مەکەن لە دوعای ڕزگاربون و شیفا
لەگەڵ هەموو موسڵمانان

## (١١٦)

ئەبێ ئەو جەژنانی ڕەمەزانە
چۆن بوبێت
کاتێک پێغەمبەری خوا محمد ﷺ
تەشریفی موبارەکی و
بۆنی خۆشی و ڕوخساری مانگی
تێکەڵی بۆن وبەرامەی عەتر و میسکی جەژن و مزگەوت بوە
هاوەڵانی بەڕێز دەوریان یاوە ...
تەوقە و باوەش و گەردن ئازایی و پیرۆزباییان لە یەکتر کردووە ...
( محمد ) ﷺ



## (١١٧)

کەس ڕزقی کەسی نەخواردوە
جار هەیە دوو کڵۆ شیرینی لێ ئەکەوێتە خوارەوانێ ...
ڕێک ئەبێتە ڕزقی مێرولەکان
خوای گەورە ویستی بوە
بەو دوو کڵۆ شیرینیە ڕزق نازڵ مێرولەکان بکات ...
تۆی کچی گەنج
تۆی کوڕی گەنج
ڕزقی زەواجتان هێت بەس دڕەنگ و زوویی کەوتوە ...
چۆن پەلاماری ڕزقێک ئەدەن کە بۆ ئێوە نیە
بڕواکە تۆی کچ شو بکەیت بە کوڕێک
بوکی مانگێک بیت ، تەڵاق ئەدرێیت
چونەکە ڕزقی ئەو کوڕە نیت
شویەکی تر ئەکەیت و ئەحەسێتەوانێ
تۆی کوڕ ژن بێنێت
دوای مانگێک ئەو ژنە تەڵاق ئەدەیت
ژنێکی تر ئەهێنی و ئەحەسێیتەوانێ

## (١١٨)

نازانم چەنەم ئێوارەتە
گریان و دڵتەنگی ...
قوڕگیان گرتویت
چەنەم ئێوارەتە
فرمێسک و ئازارت ...
چاو دادەگرن لە دیمەنی خۆر ئاوابون
بەڵام سوێن بە اللهـ هەتا مەودای خۆی تەواو نەبێ ...
تۆ لەو تاقیکردنەوەدایت
ئاگاداربە
ولله مثل الأعلى
وتەی مامۆستا و دکتۆرم (مامۆستاش بێ دەنگە لە هۆڵەکان تاقیکردنەوە)
بزانە چۆن تاقیکردنەوەت بەسەر ئەبەی
من موژدەو پێ ئەدەم ...
خوێنەری بەڕێز تۆش دوعام بۆ بکە
بە ئیزنی ڕب العالمین
ڕزگاربونو ... شیفاو...فەڕەحیو ...نزیکتە

# (١١٩)

ئەی کچ
چی وای لێکردوی وابەستەی جلی ناشەرعی بیت ؟
چی هانو ئەدات
جەستەی ناسکت بە عەزێی کورت و دەنگی پێلاوی بن بەرز و پاوانە و
بۆنی خۆش نمایش بکەیت ...؟
ئەزانیت کفنەکەت چاوەڕێتە ؟
وە ناشزانیت چ ئافرەتێکیش ئەوشوات
جلەکانت لا ئەدات و بە کفن جەستە ناسکەکەت دائەپۆشێ



# (١٢٠)

الله الله

لەو سەعات و ڕۆژەی ...

ترپەی دڵو سەریعە و ...هەناسەو سەریعە

لە بەردەم شیرینی ئارامگریەکەو ئەگری ...

الله لەو چرکە و شەوە ، یان بەیانی یان نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارەی ...

ئەڵێت چاوەڕێی شتێکی سادەم ئەکرد

خوای گەورە لەوەی خۆمی باشتر پێ بەخشیم



## (١٢١)

قەدەڕ
تەنها گوڵ و دڕکت بۆناڕوێنێ ...
باخێک گوڵت بۆ ئامادە ئەکات
دڕکەکانی ڕێگەو لە سەر لائەدات ...
بە ئازارێک ... بە گریانێک ... بە سەعاتێ بە چەنەها ساڵ چاوەڕوانی
بە سەبری ڕازی بوون بەو قەدەرە الله توشی خۆشیت دەکات



## (١٢٢)

سەیری ئەو کوڕانە بکەن کە ئەهل مزگەوتن و پەروەردەی مزگەوت و دەرسە شەرعیەکان و قورئان و فەرموودەن ... بۆنی عەتر و میسکیان لێ هێت و سیمای نورانی و تەنکە ڕیش یانیش ڕیش پڕن ...
سەیرێکی ئەو کوڕانەش بکەن
کە ئەهل گازینۆ و قوماڕ و مەشروب و تاتۆن و
دوورن لە مشتێک پەروەردەی ڕۆحی مزگەوتی ...
خۆتان بڕیار بدەن
بزانن کامیان مەترسین بۆ سەر کۆمەڵگە و کچان ...
کامیان ژەهر ئەڕێژن و
کچان وەک تەزبیحی دەستیان ئەبینن و وەک کراسەکانیان کچ ئەگۆڕن ...



## (١٢٣)

سیستمی دەنکی تەرزە و بارانی ڕێکخستوە لە باوەشی ئاسمان دا ...
سیستمی شیری ڕێکخستوە لە نێو گوانی
مەڕ و بزن و مانگادا ...
سیستمی دەنکەکانی هەنار و شوتی و بۆڵەکانی ترێی ڕێکخستوە ...
سیستی شیری دایکی ڕێکخستوە بۆ کۆرپەلەی ...
لە نێو دەریا دا سیتمی خواردن و خواردنەوەی ڕێکخستوە بۆ بونەوەرە دەریایی و ئاوییەکان ....

سبحان الله



## (١٢٤)

بۆ خۆیشم و هەموو موسڵمانان
خوای پەروەردگار
گرێ کوێرەکانی ...
سەر ڕێگەو دڵ و سینەو چاوی ...
ئێوە ئێمەش بکاتەوانێ .



## (١٢٥)

ئەبێ ئەو شەوانە چۆن بوبێت ...
کاتێ مانگە شەو و
ڕوخساری مانگ ئاسای ڕسول الله ﷺ
مونافسەیان کردوە
شەوقی هیلالی چاوانی
بۆنی میسکی هەناسە و سینەی پیرۆزی
قەدو باڵا و سێبەری پڕ بەرەکەتی
دەنگی قوڕئان خوێندن و نزا و شەونوێژ
پێشنوێژیەکانی
خۆشبەحاڵی خێزانە بەڕێزەکان و کچە بەڕێزەکانی
هاوەڵ و صەحابیە بەڕێزەکان
وەکو پەروانە لە دەوری شەم بون ...
وەکو پەپولە لە دەوری گوڵ و ڕیحانە ئاسای ڕسول الله بون ﷺ



## (١٢٦)

یـارب
تەنها سوپاس و شوکری تۆ دەکەین و
داوای ئارامگریت لێ دەکەین
لە هەموو دۆخە خۆش و ناخۆشەکان
بە نەخۆشی و لەش ساغیەوە
بە دڵتەنگی و دڵخۆشیەوە
بە بەڵا و موصیبەتەوە



## (١٢٧)

خوشکانێکی سفور هەن
کە بونەتە حیجاب الحمدلله وێڕای پیرۆزبایمان لێیان
نازانن جلە ناشەرعیەکانیان چی لێ بکەن
ئەگەر بیفرۆشنەوە پارەکەی حەرام ئەبێ
ئەگەر بیبەخشن بە کچی تر گوناحی زیاتر بۆ هێت
هەر کاتێ ئەو کچە جلەکانی ئەو کچە تازە حیجابە بپۆشێ
سەرنج ڕاکێشێ و نەزەڕی لێ بکرێ ...
شەریکی گوناهەکە ئەبن  دەیی لەبەرئەوە ، کچی بەڕێز
کاتێ خوا هیدایەتی دایت و بویتە حیجاب
جلە ناشەرعی و تەنک و کورت و تەسک و سەرنج ڕاکێشەکانو
بخە جانتا و لەسەر مەعەرز یان لە ژوورێ زیادە بیانخە سوچێکەوە هەڵیان
گرە تەنها بۆ حەڵاڵی خۆت
بەکاریان بهێنەو خۆتی بۆ بڕازێنەوە
کاتێ بەس خۆت و هاوسەرتن و
دوورن لە چاوی نامەحرەم و میوان

## (١٢٨)

ئەگەر چاوت ببەستنەوانێ ...
بوبەنە ئەو شوێنەی خەونەکەتی تێدا ئامادەکراوە
ئەبێ چی هەستێکو هەبێ ...؟ناڵێیت سوپڕازە؟
ناڵێیت چاوەڕوان نەکراوە ...
دەی ئەکید بە
خوای گەورەش کاتی ئەو گەیەنێت بە خەونی چەن ساڵەی دڵو یانیش
دوعاکانی ڕەمەزانو شەوانی قەدرو
کە تۆ هەر ئەشێت لەبیرو نەمابێت ...
لە عەرشەوە خوای گەورە ئامادەکاری کردوە بە فەرمانی کن فیکون
ئێهـ تۆش لە زەویەوە ...
ژیان ئەکەیت و
ئەشێ بەینی خۆمان بێت ناشکوریشو کردبێ
خەجاڵەتم  یاالله



## (١٢٩)

ئەم نیوەڕۆیە دراوسێیەکمان دەرچوبو
شیرینی ئەبەخشیەوانێ
لە دڵخۆشیا غەرق ببو
یاربی خوای گەورە
ئەو دڵخۆشیە پڕ خێر و بەرەکەتە
بخەیتە نێو هەموو دڵ و هەموو ماڵێکەوە
جا دڵخۆشی دەرچونە
یان دڵخۆشی شیفایە
دڵخۆشی دامەزراندنە
دڵخۆشی پاکێتی فەحسی نەخۆشیە
دڵخۆشی شادبونەوەیە
هەر کەسێ موحتاج هەر هەواڵێکی دڵخۆشیە
یاربی دڵی خۆش بکەیت
بە دڵخۆشیەک
هەموو خەم و دڵتەنگی و ئازارەکانی بەرێت و لەبیر بچێتەوانێ ...

# (١٣٠)

نازانم لە چیت کەمەو
گیرۆدەی چی خەم و ئازارێکی ...
تەنها ئەوەندە ئەزانم
خوای گەورە تاقیت دەکاتەوەو
جێو ناهێڵێت ...
قەرەبوی تەنگی دڵ و فرمێسکیشو ئەکاتەوە ...
بە وەعدەی لوتفی خۆی
قوله تعالى: (فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً ، إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً)



# (١٣١)

قەت نەبووە خونچەیەک ڕاستەوخۆ ببێت بە گوڵ
یان شیلەیەك هەنگ یەکسەر بیکات بە هەنگوین
هەریەکەو کاتی تایبەت بەخۆیان هەیە
نە ساتێ دواکەوێ نەپێش ئەکەوێ
هەر یەکەیان لە جێگەی گونجاوی خۆیان
بە ئەمری الله تعالی
قۆناغەکان و سوڕەکانی خۆیان تەواو ئەکەن ...
خەونەکەی تۆش
قبوڵ بونی دوعاکەی تۆیش وایە پێی ناگەیت
هەتا سوڕ و قۆناغەکەی خۆی تەواو نەکات
هەتا ئەمری الله دەرنەچێت
دونیا لە پشتت بێت پێی ناگەیت
کاتێ ئەمری الله هاتەجێ دونیا لە دژت بێت هەر پێی دەگەیت
قەڕەبوی الله تعالی چێژ بەخش و شیرینە
هێندەی تاڵی ئارامگریەکە
چێژی ئەگاتە سینەو دڵو

## (١٣٢)

کچی بەڕێز

ببە بەو کچەی

بەهۆی دین و ڕەوشتی بەرزو حەیا و حیشمەتو

کوڕێکی لە خواترسی ڕەوشت بەرزی ئەهلی مزگەوت

لە نێو سوجددەدا نزای بەدەستهێنانو بکات

نەشزانێ ڕوخسار و ڕەنگی چاویشت چۆنە چونەکە سەیرو ناکات و چاوی دادەخات لە ئاستو ...



# (١٣٣)

کچە حیجابەکانیش
بە ئیزن الله هەتا ئەو دەقەی ئەبنە موڵکی کەسێک
لە دنیایەکی پڕ شاردنەوەی جوانی و ڕازاوەیی ئەژین ...
خۆیان قفڵ و سجن ئەکەن
ئەزانن بۆ ؟
کلیلەکەی تەنها لای خوای گەورەیە
ئەزانن خوای گەورە قەدەری بۆ نوسیون
شەڕی قەدەر ناکەن
تشبیهـ نەبێت
چۆن هەر دەرگایەک
کلیل تایبەت بە خۆی هەیە
ئاواش هەر کچێک و کوڕێک
کلیلی تایبەت بەخۆیان هەیە
ڕزقی تایبەتی یەکترن

## (١٣٤)

خوایەک بەو گەورەیی و بەڕەحمیەی خۆی
بە گەرمای نیوەڕۆی هاوین ...
باران دەبارێنێ و
بۆنی زەوی خۆش دەکات ...
تۆی بەندەش جێ ناهێڵێت و
ئاگای لەو سەختی دڵ و سینەو جەستەیەتە
کە ئارامی لێ بڕاوە
لە لوتکەی ئازار و ناڕەحەتی دایە
سەرەی خۆشیەکانی تۆش هێت ...
ئەی ئەو کەسەی خۆشیت نەدیوە



## (١٣٥)

دوای جەژنی قوڕبان
بۆ ئەوانەی ئێستە لە خەتمن
بەیانیش بێت ئەبێت بۆ ئەوانەی نیەتی خەتمیان هەیە
خەتمەیەک دانێن وەرەقەیەکی بخەنە نێو موصحەفەکە لێی بنوسن
پزیشکی دڵم
هێورکارەوەی دڵم
حەزەکەی هەر لە نۆت مۆبایلەکەیشو بینوسە ...
ڕۆژانە بچۆ خزمەتی
گەر مجالیشو نابێ ،، دوو لاپەڕە هەر لێی بخوێنە ...



# (١٣٦)

ئەی خاوەن ئاسمانەکان و زەوی و کەون
ئەی ئەو زاتەی فەرمانەکەت کن فیکون ە یا الشافی یاالجبار ...
لە ئەم عەسرو ئێوارەی جەژنی قوربان و هەینی یەدا
بارانی شفایەکی بە ڕەحمەت
خوێنی تازە
برژێنیتە نێو ئەو جەستانەی
لە نەخۆشانەکان یان لە ماڵەوەدان
لە سەر جێگەن یانیش چاوەڕێی نەتیجەی فەحسن دوای جەژن
شیفای ڕەحمەت و بەتاڵبونەوە
بۆ ئەو سیحر و چاوە پیسانەی لە مێشک و دڵ و سینەدان
کردنەوەی ئەو قفڵانەی
کلیلەکەی بەس لای تۆیە
امین امین یارب العالمین
םבםבﷺ.
اللهمَّﷺصَلِّﷺوَسَـــلِّمْﷺعلى نَبِيِّنَـــاﷺمُحمَّد.